بەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزو پێزتر
لە کوردستان دا
-٢-

چەند ڕێنموونی یەك بۆ



# حاڵەتی ئیسلامی
## لە کوردستاندا

بەشی سێ یەم

بەجێ هێنانی مافی برا لەبەر خواو نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەك وجیا

نووسینی - عەلی باپیر

١٤١٧ ك    چاپی یەکەم    ١٩٩٦ز
هەولێر

بەرەو واقیعێکی ئیسلامی بەهێزو پێزتر
لەکوردستان دا

- ٢ -

چەند ڕێنموونی‌یەك بۆ

# حاڵەتی ئیسلامی

## لە کوردستاندا

### بەشی سێیەم

بەجێ‌هێنانی مافی برا لەبەر خواو نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەك‌و جیا

نووسینی : عەلی باپیر

چاپی یەکەم

١٤١٧ ك — ١٩٩٦ ز

هەولێر

## پێشکەش بێ بە:

- هەڵگرانی شیعاری بەرزی پڕ ڕێز ( لاإلە إلا اللە محمد رسول اللە )
- ڕێبوارانی تەنها ڕێبازی ڕاستو بەهێزو پێز ( ئیسلام ).
- ئەوانەی دینی خودایان لەڕووی قورئانو سوننەتەوە وەك خۆی ناسیوەو، قاڵبی گچکە گچکەیان لەبۆچوونی خۆیانو خەڵکیان بۆ هەڵنەتاشیوەو بازنەی برایەتییان هێندە فراوانو بەرینە هەموو ئەهلی ئیسلامی تێدا دەحەوێتەوەو هیچ کەس والێناکەن بسڵەمێتەوە، واتە بەئیسلامییە ژیرو خواپەرستو ڕەوشت بەرزو سەربڵندەکان.

# پێناسەی ئەم زنجیرەیە

الحمد لله وكفى وصلاته وسلامه على عباده الذين اصطفى، خصوصا محمد وآله الكرام وصحبه الشرفاء .

بێ‌گومان بەرەوپێش‌بردنی کاری ئیسلامی‌و بەهێزوپێز کردنی ئەرکی سەرشانی مسوڵمانانەو ئێمەی مسوڵمانی کوردیش لە کوردستاندا بەتایبەتی‌و لەهەر جێیەکی دیکەشدا کە بۆمان بلوێ بەگشتی ئەو ئەرکو پێویستی‌یەمان لەسەرشانە. شتێکی ڕوونو ئاشکراشە کە شارەزایی‌و بەرچاو ڕوونی تێروتەواویش لەهەر کارێكدا هەنگاوی یەکەمو مەرجی سەرەکی سەرگرتنو بەئەنجام گەیشتنیەتی، بۆیە منیش وەك مسوڵمانێکی کورد لە کوردستاندا بۆ جێبەجێ‌کردنی بەشێك لە ئەرکی سەرشانم بەپێویستم زانی لەم قۆناغە گرنگو دژوارەدا کە گەلی کوردی مسوڵمانی پێدا تێدەپەڕێ دەست‌بەکاربم بۆ نووسینی ئەم زنجیرەیە کە خوا پشتیوانبێ نێوەرۆکیشی وەك ناوی دەبێتو، دەبێتە بنەماو بنچینەیەك بۆ زیاترو چاکتر گەشەکردنو بەرەوپێش‌چوونی کاری ئیسلامی‌و هاتنەکایەی واقیعێکی ئیسلامی ڕەسەنترو بەهێزوپێزتر لە کوردستاندا . وە لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەمڕۆ کوردستان بەگشتی بۆتە جێی سەرنجو تێڕوانینو مەڵبەندێکی گرنگو جێی ئەمیەت پێدانی دنیا، بێ‌گومان بەهێزوپێزتربوونی واقیعی ئیسلامی لەوێدا کاریگەری‌یەکی بەهێزو ڕاستەوخۆی دەبێت بۆسەر جیهانی ئیسلامی بەگشتی‌و ناوچەکانی دەورووبەر بەتایبەتی .

هەڵبەتە پاش یارمەتی خودای میهرەبانو کاربەجێ ئومێدی زۆریشم بە هەوڵو هیممەتی دڵسۆزانە کە هەرچی زیاتر ئەم زنجیرە باسە دەوڵەمەندترو دامەزراوتر بکەن بەهۆی تێبینی‌و سەرنجڕاکێشانو پێشنیاری دڵسۆزو بنیاتنەرانیش



ئیدی دەست لەدەستو بەرەکەت لەخوا .

# پێشەکی

حاڵەتی ئیسلامی کوردستان ـ مەبەست کوردستانە بەگشتیو بەتایبەت کوردستانی سەر بەعێراق ـ بەشێکە لە حاڵەتی ئیسلامی گشتی لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامداو دەنگو ڕەنگو سەنگی هەیە .

جا بێگومان حاڵەتی ناوبراو وەك هەر هەوڵێکی تری مرۆڤ لەکەمو کوڕیو کرچوکاڵی خاڵی نیەو پێویستیی بە کردوکۆشی زۆر دەکات بۆ گەیشتنو کامڵبوونیو پاشان: «بەرگرتنی» . جا ئەم چەند خاڵەی لە دووتوێی ئەم ئاڵقەیەدا زۆر بەگوشراوی دەیاننووسم هەنگاوێکن بۆ گەیاندنو کامڵکردنی حاڵەتی موبارەكو پڕپیتوپێزی ئیسلامی کە تاقە جێگای متمانەو ئومێدی جەماوەری مسوڵمانە لە کوردستاندا ، بەهیوای ئەوە کە ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی پڕخێروبەرەکەتبێو بەرهەمداربێو حاڵەتی ئیسلامیش لەوڵاتی کوردستانو هەندەرانیش ڕۆژبەڕۆژی زیاتر سەقامگیرو دامەزراوو بەرقەراربێ . خودای میهرەبانیشمان بەڵێنی داوە: «والذین جاهدوا فینا لنهدیهم سبلنا وان الله لمع المحسنین» العنکبوت(٢٩) .

# چەند تێبینییەکی گرنگ

١ـ وەك لەپێشەکی ئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا گوتوومانە: بۆیە باس و لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن دەربارەی بزووتنەوەی ئیسلامیمان کردۆتە ئاڵقەی یەکەم، چونکە بزووتنەوە براگەورەو سەرقافڵەو سێبەری حاڵەتی ئیلامییە لە کوردستانداو ساغی و نەخۆشیشی ڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر هەموو حاڵەتەکە. جائەوە لەم ئاڵقەی دووەمەشدا ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو حاڵەتە ئیسلامییەکەی کوردستاندا دەدوێین، دوای ئەوەی لەبارەی سەرقافڵەکەیەوە دواین و هەڵمانسەنگاند.

٢ـ ئەم نامیلکە هەمووی(١٣) خاڵە ـهەتا ئیستـ جـارانم زیاتر دەکات یانـا !ـ وە بۆ ئاسانتر خوێندرانەوەو بلاوکردنەوەی ئەوا جگە لە خاڵی سێزدەم ئەگەرنا هەر دوو خاڵێکمان لێ کردۆتە باسێکی سەربەخۆ بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی یەکەم: خاڵی(١)و(٢): «چاکتر تێگەیشتنی دین و باشتر ئاشنابوون بەژین».

بەشی دووەم: خاڵی(٣)و(٤): «برایەتی قووڵ و فراوان و ڕێز لەبوون و کاری یەکترنان».

بەشی سێیەم: خاڵی(٥)و(٦): «بەجێهێنانی مافی برا لەبەر خواو نەبوونی دوو هەڵوێستی دژبەیەك وجیا».

بەشی چوارەم: خاڵی(٧)و(٨): «پێ لە کرچ و کاڵی خۆنان و دان بەفەزڵ و چاکەی یەکتر هێنان».

بەشی پێنجەم: خاڵی(٩)و(١٠): «تاقە دینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونەوەو تەنها ڕێی حوکمڕانیشی توانایی‌و دەسەڵاتدار بوونە» .

بەشی شەشەم: خاڵی(١١)و(١٢): «کۆمەڵو تەوژمە ئیسلامی‌یەکان تەواوکەری یەکترن‌و لەهەموو کەس لەیەك نزیکترن» .

بەشی حەوتەم: خاڵی(١٣): «پێکهێنانی کۆڕێکی ڕاوێژی فراوان کەمترین مەرجی برابوون‌و یەکەمین هەنگاوی یەکبوونە» .

٣- پێشینان گوتوویانە: «دۆست ئەوەیە کە دەتگریێنێ ...» جا بەندە کەم‌وزۆر لەم ڕێنمووییانەدا پەنجە لەسەر نەخۆشی‌و کەم‌وکوڕی‌یەکانی حاڵەتی ئیسلامی لە کوردستان دادەنێ‌و بەناچاری ئاماژەش بۆ کۆمەڵو تەوژمەکانی دەکرێ، هیوادارم هیچ کەسێ لێمان لەدڵ‌نەگرێ‌و مەعنای خراپی لێنەداتەوەو ئەنجامێك کەخۆم نەمویستووە لێی نەگرێ .

٤- لەبەر ئەوەی لەئاڵقەی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا«بزووتنەوەی ئیسلامی‌و قۆناغی نوێی» تا ڕاددەیەکی باش بزووتنەوە وەك گۆشتی سەرچەپەرێ خراوەتە گۆڕێ‌و لەتەتەڵەو بێژینگ دراوە، لەم ئاڵقەیەدا کەمتر ڕووی تێکراوەو زیاتر تەئکید لەسەر«حاڵەتی ئیسلامی» کراوە بەگشتی‌و جاروباریش کۆمەڵو تەوژمەکانی بەتایبەت قسەیان لێ‌کراوە

# ڕێ‌خۆشکردن

خوێنەری سەنگین! ئەم بەشە کەبەشی سێ‌یەمی (چەند ڕێنموونی‌یەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی لەکوردستاندا)یە خاڵی پێنجەمو شەشەمی تێدایە، چونکە دوای ئەوەی لەبەشی دووەمدا چاوێکمان بەچەمكو واتای (برایەتی)دا خشاندو پاشان ئاماژەیەکمان بۆ یەکەمین بەرهەمی ئەو برایەتی‌یە کرد کەبریتی‌یە لە (ڕێز لەبوونو کاری یەکتر نان)، جێ‌ی خۆیەتی لەم بەشەدا دوو مەسەلان بتوێژینەوە، یەکەم (بەجێ‌هێنانی مافی برا لەبەر خوا) بۆ ئەوەی هیچ کەس چاك نەبوونی بەرانبەرەکەی نەکاتە پاساودەر (مبرر)ی هەڵوێستی خراپو ناشەرعی خۆی، چونکە جێ‌بەجێ‌کردنی مافی برایەتی جۆرێکە لەخواپەرستی‌و طاعەت کەئینسان بۆ خوا پێ‌ی هەڵدەستێ‌و نابێ‌ باباى مسوڵمان لەهیچ شتێکی تری ببەستێ، چونکە خواپەرستی (عبادة) بەبێ‌ بەرانبەر (مقابل) ئەنجام دەدرێ، مەگەر پاداشتی خوای بەرزو بێ‌ نیاز. دووەم (نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەكو جیا) کەلێرەدا مەبەست دەرو دەروون (ظاهر وباطن) یەکبوونو هەڵوێستی بەرەو ڕوو و پاش‌ملە جووت بوونە، نەك خوانەخواستە بەڕواڵەتو ڕووبەڕوو شتێك بڵێین، بەڵام لەدەروونو پاشملە شتێکی‌تر بکەین‌و خۆمان دووچاری دەردی کوسندەی دووانەتی (الإزدواجية) بکەین، کەئەوەش هەر ناوی نوێ‌و دەروونناسەی نەخۆشی‌یە کۆنەکەی دووڕوویی (ذو الوجهين)یە کەبێگومان خەسڵەتێکی بەدی نیفاقو دەغەڵانە!

هەڵبەتە بەش و خاڵەکانی ئەم نووسراوە وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك یەکتر دەبەستنەوەو تەواو دەکەن و بۆیەش ئەم بەشە بەدوای بەشی دووەم دا هات، چونکە (برایەتی قووڵ و فراوان و ڕێز لەبوون و کاری یەکتر نان) ئەگەر ڕاست و تەواوو دامەزراو بێ یەکسەر دەبێتە هۆی پەیدابوونی (بەجێ هێنانی مافی برا لەبەر خواو نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەك و جیا). شایانی باسیشە کەبەندە هەروا بەبەلاش و بێ حیکمەت ئەو باسانەی ئاوا ڕێز نەکردوون و، ئەوە هەمووی زادەو بەرهەمی ئەزموونگەلێکی تاڵ و موعانات و ئێش و ژانێکی بەسووت و سوێیە لەگۆڕەپان و واقیعی کاری ئیسلامی دا.

لەخوای میهرەبانیش داواکارم هەرچی زیاتر پیت و پێز بخاتە ئەم زنجیرە باسەو براو خوشکە بەڕێزە ئیسلامی یەکانم سوودو تام و چێژیان لێ وەربگرن و ببنە مایەی گەشەکردن و بەرەو پێش چوونی کارو خەبات و جم و جۆڵ و چالاکی ی ئیسلامی یانە لەکوردستان دا، هەتا بەپشتیوانی ی خوداو پاشانیش هەوڵ و هیممەتی هەموو لایەك بگاتە ئاستی پێویستی ی خۆی و، بەرهەمی چاوەڕوانکراوی خۆی پێشکەش بەکۆمەڵگاکەمان بکات، کەبریتی یە لەژیان و گوزەرانێکی شەرعی یانە لەژێر سایەی کیان و دەسەڵاتێکی ئیسلامی دا، کەهەر ئەوە مایەی بەختەوەری ی دنیاو سەربەرزی و سەرفرازی ی دواڕۆژە.

# خاڵی پێنجەم: بەجێهێنانی مافی برا لەبەر خوا

ئەم خاڵە لەژێر ناوونیشانی دوو سەرباسی كورتدا پێشكەش دەكەین:

## ١ـ ئەركو مافەكانی برایەتی لەئیسلامدا:

بۆ ڕوونكردنەوەی ئەركو مافەكانی برایەتی لەئیسلامدا وا ئەم چەپكە گوڵە لەگوڵزاری فەرمایشتە پیرۆزەكانی پێغەمبەر ﷺ دێنینەوە:

■ ﴿المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا، وشبك أصابعه﴾ متفق عليه، واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوارە هەندێكی هەندێكی مەحكەم دەكات، وەپەنجەكانی هەردووك دەستی خستە نێویەكو توندی كرد.

ئیمام قورطوبی لەلێكدانەوەی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی: «ئەمە وێنە هێنانەوەیەكە مەبەست پێ‌هاندانە لەسەر هاوكاری بڕوادار بۆ بڕوادارو یارمەتی دانی، وەڕوونی دەكاتەوە كەئەمە شتێكی داكۆكی لەسەركراوو پێویستە، چونكە خانوو تەواو نابێ‌و سوودی لێ نابینرێ ئەگەر هەندێكی هەندێكی ڕانەگرێ‌و بەهێزی نەكات، وەئەگەر وانەبێ هەموو بەشەكانی لەیەك دەترازێن‌و خانووەكەش لەبەر یەك هەڵدەوەشێ، بڕوادارێش بەهەمان شێوە بەبێ یارمەتی‌و پشتیوانی‌ی برایەكەی ناتوانێ كاروباری دینداری‌و دنیایی خۆی ڕاپەڕێنێ‌و، بەبێ هاوكاری لەبەردەم جێ‌بەجێ كردنی كاروباری‌دا دەستەوستان دەبێ‌و ناتوانێ بەرهەڵستی‌ی زەرەرو زیانەكان بكات‌و، لەحاڵێكی واشدا كاروباری دین‌و ژینی لێ تێك

دەچێ و دەفەوتێ»(١).

■ ﴿المسلم أخو المسلم لايظلمه ولايسلمه، من كان في حاجة أخيه كان الله في حاجته، ومن فرج عن مؤمن كربة فرج الله عنه بها كربة من كرب يوم القيامة، ومن ستر مسلما ستره الله يوم القيامة﴾ متفق عليه، واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە نەستەمی لێ دەكات و نەتەسلیمی دوژمنیشی دەكات، هەركەسێك پێویستی ی برایەكی خۆی جێبەجێ بكات، خوا پێویستی یەكانی بۆ جێبەجێ دەكات، وە هەركەسێك خەمێك لەمسولمانێك بڕەوێنێ، خوا خەمێك لەخەم و پەژارەكانی قیامەتی لێ دەڕەوێنێ، وەهەركەسێك عەیبی مسوڵمانێك بپۆشێ، خوا ڕۆژی دوایی دەیپۆشێ.

■ ﴿المسلم أخو المسلم لايخونه ولايكذبه ولايخذله، كل المسلم على المسلم حرام عرضه وماله ودمه، التقوى ههنا، بحسب امرئ من الشر أن يحقر أخاه المسلم﴾ رواه الترمذي وقال حديث حسن (ورواه مسلم بلفظ آخر)، واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ناپاكی ی لەگەڵ ناكات و درۆی لەگەڵ ناكات و لەكاتی لێقەوماندا پشتی بەرنادات، هەموو شتێكی مسوڵمان لەمسوڵمان حەرامە؛ ئابڕوو و حورمەتی و ماڵی و خوێنی، پارێزكاری لێرەدایە - ئاماژەی بۆ دڵی موبارەكی كردووە - ئینسان ئەوەندە خراپەی بەسە كەبرای مسوڵمانی خۆی بەسووك بگرێ.

---

(١) انە: پەراویزی (ریاض الصالحین)، ل١١٨.

■ ﴿لايؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه مايحب لنفسه﴾ متفق عليه، واته: یەکێك لەئێوە بڕوا ناهێنێ - مەبەست بڕوای کاملە - هەتا ئەوەی بۆ خۆی حەزی لێدەکات بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت (دیارە ئەم فەرموودەیە چەمکی پێچەوانە «مفهوم المخالفة»کەشی هەر ڕاستەو دەبێ چیی بۆ خۆی پێناخۆشە بۆ برای مسوڵمانیشی پێی ناخۆش بێت).

■ ﴿أنصر أخاك ظالما أو مظلوما. فقال رجل: يارسول الله أنصره إذا كان مظلوما، أرأيت إن كان ظالما كيف أنصره؟! قال: تحجزه - أو تمنعه - من الظلم فإن ذلك نصره﴾ رواه البخاري، واته: یارمەتی براکەت بدە زۆردار بێت یان زۆر لێکراو. پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر ستەم لێکراو بوو یارمەتیی دەدەم، بەلاّم ئایا ئەگەر زۆردار بوو چۆن یارمەتیی بدەم؟ فەرمووی: دەیگێڕییەوە - یان پێشگیری لێ دەکەی - لەزوڵم، چونکە ئەوە یارمەتی دانیەتی.

■ ﴿حق المسلم على المسلم ست؛ إذا لقيته فسلم عليه، وإذا دعاك فأجبه، وإذا استنصحك فانصح له، وإذا عطس فحمد الله فشمته، وإذا مرض فعده، وإذا مات فاتبعه﴾ رواه مسلم، ورواه البخاري بنحوه، واته: هەقی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش - شتـ - ن؛ ئەگەر پێی گەیشتی سەلامی لێبکە، وەئەگەر دەعوەتی کردی - یان بانگی کردی بۆ هەر کارێك کەشەرعی بێ - بەدەنگییەوە بچۆ، وەئەگەر داوای ئامۆژگاریی لێ کردی ئامۆژگاریی بکە، وەئەگەر پژمی و سوپاسی خوای کرد پێی بڵێ (یرحمك الله)، وەئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی بکە، وەئەگەر مرد دوای - جەنازەکەی - بکەوە. (دیارە مەبەست لەم

شەشانە لێرەدا مافە سەرەکی و بەرچاوەکانن ئەگەرنا مافەکانی برایەتی لەئیسلامدا هەر لەمانەدا کورت هەڵنەهاتوون، بەبەڵگەی ئەوە کەلەفەرمایشتی تردا ئی دیکەش باسکراون، بۆ وێنە لەفەرموودەیەکدا کە (متفق علیه)یە لە (براء بن عازب)ەوە دەفەرموێ ﴿أمرنا رسول الله ﷺ بسبع... وابرار المقسم﴾.

■ ﴿لاتباغضوا ولاتحاسدوا ولاتدابروا ولاتقاطعوا، وكونوا عباد الله إخوانا، ولايحل لمسلم ان يهجر أخاه فوق ثلاث﴾ متفق علیه، واتە: یەکتر مەبوغزێنن، وەحەسوودی بەیەکتر مەبەن، وەپشت لەیەکتر مەکەن و لەیەکتر دامەبڕێن، وەئەی بەندەکانی خوا پێکەوە برابن، وەحەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك کەلەسێ ڕۆژان زیاتر واز لەبرای خۆی بێنێ -ونەیدوێنێ-.

دەتوانین لەکۆی ئەم حەوت فەرموودەیە کەمشتێکن لەخەروارێك ئەم خاڵانە دەربارەی هەق و مافی برایەتی ی نێوان مسوڵمانان لەسەر یەك بنووسین:

١- دەبێ پشت و پەنای یەکتر بن و یەکتر بەهێز بکەن و دەستبار بۆ یەکتر بگرن.

٢- نابێ هیچ جۆرە زوڵم و ستەمێك لەیەکتر بکەن هەر لەگومانی بەد (سوء الظن)ەوە بگرە هەتا حەسوودی و زەم و غەیبەت و جاسووسی و جنێو لێدان و ماڵ زەوت کردن یان دزین و کوشتن و خیانەتی ناموس.

٣- نابێ لەبەرانبەر دوژمندا لەیەکتر بێ دەنگ بن و یەکتر تەسلیمی دوژمن بکەن.

٤- دەبێ پێزیستی یەکانی یەکتر بەپێی بۆلوان جێ بەجێ بکەن.

٥- دەبێ بەپێی توانا خەمو خەفەتی یەکتر لابەرن‌و گرفت‌و کێشەی یەکتر حەل بکەن.

٦- دەبێ عەیب‌و عاری یەکتر داپۆشن مادام فەوتانی هەقێکی شەحسی، یان بەرژەوەندی‌یەکی گشتی گرنگتر لەو عەیب پۆشینەی تێدا نەبێ.

٧- نابێ هیچ جۆرە خیانەتێك بەیەکتر بکەن.

٨- نابێ درۆ لەگەڵ یەکتر بکەن.

٩- نابێ لەکاتی تەنگانەو لێقەوماندا پشتی یەکتر بەربدەن.

١٠ - دەبێ هەموو شتێکی یەکتر لەسەر خۆیان بەحەرام بزانن - مەگەر شەرع حەڵاڵی کردبێ - بەتایبەت ئابڕوو وناموس‌و ماڵ‌و خوێن.

١١- دەبێ چی‌یان بۆخۆیان پێ خۆشە بۆ یەکتریش پێیان خۆش بێ‌و. چی بۆخۆیان حەزی لێ‌ناکەن بۆیەکتریش هەروابن.

١٢- دەبێ نەهێڵن هیچ کامێکیان نەستەمی لێ‌بکرێ نەستەمیش بکات.

١٣- دەبێ ڕێزی یەکتر بگرن‌و یەکتر بەسووك نەگرن نەبەقسە نەبەکردەوە، بگرە بەدڵیش.

١٤- ئەگەر بەیەکتر گەیشتن سەلام لەیەکتر دەکەن - وەڵامی سڵاوی یەکتریش دەدەنەوە..

١٥- لەگەڵ یەکتردا قسە خۆش‌و ڕوو گەش‌ن ﴿والكلمة الطيبة صدقة﴾ متفق عليه، ﴿لاتحقرن من المعروف شيئا ولو أن تلقى أخاك بوجه طليق﴾ رواه مسلم.

١٦- هەرکاتێك بانگی یەکتری‌یان کرد بەدەنگ یەکترەوە دەچن - مەگەر بۆ کاری خراپ‌و بێ‌شەرعی..

١٧- لە دەعوەتی یەکترەوە دەچن - مەگەر بزانن حەڕام‌و بێ‌شەرعی تێدایە..

١٨- لەكاتی ڕاوێژ بەیەكتر كردنو داوای ئامۆژگاری‌دا ئامۆژگاریی یەكتر دەكەنو دریغی ناكەن.

١٩- حەز بەچاكەو خێری یەكتر دەكەنو ئێرەیی (حسد) بەیەكتر نابەن.

٢٠- پشتگیری یەكتر دەكەنو پشت لەیەكتر ناكەن.

٢١- هەمیشە لەگەڵ یەكتر دەبنو لەیەكتر دانابڕێن.

٢٢- ئەگەر لەیەكتریش توورەبن لە (٣) ڕۆژان زیاتر دەنگ لەیەكتر ڕاناگرن.

٢٣- هەركاتێك یەكێكیان پژمیو گوتی: سوپاس بۆ خوا (الحمد لله) پێی دەڵێن: خوا ڕەحمت پێ بكات (یرحمك الله).

٢٤- لەكاتی نەخۆش كەوتن‌دا لەیەكتر دەپرسنو سەردانی یەكتر دەكەنو دوعاو قسەی خێر بۆ یەكتر دەكەن.

٢٥- ئەگەر یەكێكیان سوێندی خوارد بەپێی توانا هەوڵ دەدەن سوێندەكەی لێ نەخەن.

٢٦- یەكتری‌یان خۆش دەوێتو هیچ جۆرە بوغزو ڕقو كینەیەكیان لەگەڵ یەكتر نیە.

٢٧- هەركاتێك شەهید بوو، یان وەفاتی كرد دوای تەرمەكەی دەكەوێو بەشداری‌ی ناشتنی دەكات.

هەڵبەتە دەگونجێ لەم خاڵانە زۆر زیاتر لەم فەرمایشتانەو غەیری ئەمانیش لەدەقەكانی قورئانو سوننەت هەڵهێنجین دەربارەی ئەركو مافەكانی برایەتی لەئیسلامدا، بەڵام ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە كەهەرچی لەو بارەوە هەیە بینووسین، بۆیە بەم ئەندازەیە واز دێنینو دەچینە سەر باسی دووەمی ئەم خاڵی پێنجەمە:

## ٢ـ بەجێهێنانی مافی برا لەبەر خوا:

شتێکی ئاشکرایە کەلەڕوانگەی ئیسلامەوە هەموو چالاکی‌و جم‌و جۆڵ‌و کردەوەو ڕەفتاری ئینسان بەخواپەرستی (عبادة) لەقەڵەم دەدرێن‌و، خوای بەرزو مەزن کەفەرموویەتی: ﴿وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون﴾ الذاريات (٥٦)، ناگونجێ مەبەست بەس ئەو شتانە بن کەلەعورفی زانایانی شەرعدا بەخواپەرستی (عبادة) ناسراون، وەك: نوێژو ڕۆژوو و زەکات‌و حەج‌و زیکرو دوعاو ... هتد!، وەلەڕاستی‌دا زانایانی ئیسلامیش بەس بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی لایەنە جۆراو جۆرەکانی ئیسلام‌و وەك مەسەلەیەکی زانستی‌ی ڕووت زانیاری‌یەکانی شەرعیان بۆ (عبادات)و (معاملات)و (جنايات)... دابەش کردووە، ئەگەرنا وەك گوتمان ئیسلام هەموو جم‌و جۆڵ‌و چالاکی‌یە شەخسی‌و کۆمەڵی‌و ماددی‌و مەعنەوی‌یەکانی ئینسان بەخواپەرستی لەقەڵەم دەدات وەبابای مسوڵمان لەهەر بوارو لایەنێکی ژیان‌و گوزەرانی‌دا سەرگەرمی کردوکۆش‌و چالاکی بێت واهەست ناکات کەلەجوغزی خواپەرستی چۆتە دەرێ‌و، مەیدانی پان‌و پۆڕی ژیانی لێ دەبێتە میحراب‌و پەرستگا (معبد)!

جایەکێك لەو چالاکی‌و جم‌وجۆڵە هەرە گرنگ‌و مەزنانەی ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە کەلەبواری برایەتی‌و هەڵس‌و کەوتی نێو کۆمەڵ‌و کۆمەڵگای ئیسلامی‌دا ئەنجامی دەدات، لێرەش‌دا بەر لەوەی بچینە نێو قووڵایی باسەکەوە بەپەسندی دەزانم ئەم چەند دەقە بۆ دەرخستنی گرنگی‌و بایەخ‌و گەورەیی برایەتی‌و یەکتر خۆشویستن بخەمە ڕوو:

■ ﴿ثلاث من كن فيه وجد بهن حلاوة الإيمان: أن يكون الله

ورسوله أحب إليه مما سواهما، وان يحب المرء لايجبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار﴾ متفق عليه، واتە: سێ ـ خەسڵەت ـ لەهەر كەسێكدا هەبن بەهۆی ئەوانەوە شیرنایەتی ئیمانی چێژتوە: كەخواو پێغەمبەرەكەی لەلا خۆشەویستتر بێ لەغەیری وان، وەكەئینسانێكی خۆشویست بەس لەبەر خوا خۆشی بوێ، وەكە پێی ناخۆش بێ بگەڕێتەوە نێو كوفر دوای ئەوەی خوا قوتاری كردووە لێی، وەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە.

■ ﴿والذي نفسي بيده لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولاتؤمنوا حتى تحابوا، أولا أدلكم على شئ إن فعلتموه تحاببتم؟! أفشوا السلام بينكم﴾ رواه مسلم، واتە: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتێ هەتا بڕوا نەهێنن، وەبڕوا ناهێنن هەتا یەكترتان خۆش نەوێ، ئایا شتێكتان پێبڵێم ئەگەر كردتان یەكترتان خۆش بوێ؟ سەلام لەنێو خۆتان بڵاوبكەنەوە (دیارە سەلام كردن لێرەدا سەردانو چاكەو چۆنیو هەواڵپرسیو... هتدیش دەگرێتەوە﴾.

■ ﴿إن الله تعالى يقول يوم القيامة: أين المتحابون بجلالي؟ اليوم أظلهم في ظلي يوم لاظل إلا ظلي﴾ رواه مسلم، واتە: خوای بەرز ڕۆژی دوایی دەفەرموێ: ئەوانەی لەبەر گەورەییو شكۆیی من یەكتریان خۆش دەویست لەكوێن؟ ئەمڕۆ لەژێر سایەی خۆمدا سێبەریان لێدەكەم، ئەو ڕۆژە كەجگە لەسایەی من هیچ سایەیتر نین.

■ ﴿قال الله تعالى: وجبت محبتي للمتحابين في المتجالسين في والمتزاورين في والمتباذلين في﴾ حديث صحيح رواه مالك بإسناد صحيح في الموطأ، واتە: خوای بەرز فەرموویەتی: خۆشویستنی من پێویست بووە بۆ یەکتر خۆشویستان لەپێناوم داو پێکەوە دانیشتووان لەبەر منو سەردانی یەکتر کەران لەڕێی من داو لەیەکتر بووردان لەبەر خاتری من.

ئێستا کەلەبەر تیشکی ئەم فەرمایشتانەدا تاڕاددەیەك زانیمان گرنگیو پلەو پایەی برایەتیو یەکتر خۆشویستن لەئیسلام دا چۆنە! بابێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست:

مادام برایەتیو جێ بەجێ کردنی ئەركو مافەکانی برایەتی لەگەڵ یەکتردا بەشێکی گرنگو گەورەی خواپەرستی بێت - ئەگەر وەك هەر جۆرە خواپەرستی یەکی تر دوو مەرجی «شەرعی بوون»و «بۆ خوا بوون» واتە (الإتباع والإخلاص)ی تێدا ڕەچاوکرابن -، بەڵێ مادام وابێ درووستو ڕەوا نیە کەبەدەستەواو لەبەرانبەری شت دا بکرێ، چونکە ئەو کاتە دەبێتە جۆرێك لەبازرگانی مامەڵە پێکەوە کردن وەزیاتر قاڵبێکی دنیاییو سیاسیو کۆمەڵایەتی ڕووت بەخۆیەوە دەگرێو، جیاوازی یەکی نابێ لەگەڵ هەڵسو کەوتو ڕەفتارو پەیوەندی خەڵکی تری نائیسلامیو نامسوڵمان لەگەڵ یەکتر!

هەر بۆیەش خوای میهرەبانو زانا فەرموویەتی: ﴿يوفون بالنذر ويخافون يوما كان شره مستطيرا. ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا، إنما نطعمكم لوجه الله لانريد منكم جزاء ولاشكورا﴾ الإنسان (٧-٩)، هەروەها لەوەسفی یەکێك لەبەندە هەڵبژاردەو هەرە باشەکانی دا - کەلەسەر ڕای زۆربەی هەرە زۆری

توێژەرەوانی قورئان (أبو بكر الصديق)ە خوا لێی ڕازی بێ(١) فەرموویەتی: ﴿وسيجنبها الأتقى، الذي يؤتي ماله يتزكى، وما لأحد عنده من نعمة تجزى، إلاابتغاء وجه ربه الأعلى، ولسوف يرضى﴾ الليل (١٧-٢١).

هەڵبەتە شتێکی زۆر ڕوونە کەمسوڵمان پێویستە لەبەرانبەر چاکەو پیاوەتی یەکتردا هەر چاکە بکەن وەك خوای زانا فەرموویەتی: ﴿هل جزاء الإحسان إلا الإحسان؟﴾ الرحمن (٦٠)، بەڵام مەبەستمان لە (بەجێ‌هێنانی مافی برا لەبەر خوا) ئەوەیە کەبابای چاکەکارو برای باش‌و دڵسۆز، لەبەرانبەر چاکەو برایەتی جێ‌بەجێ‌کردنەکەیدا چاوەڕوانی لەبەرانبەرەکەیدا نەکات‌و کورد گوتەنی (چاکەو خێر بەدەستەوا نیە!)، بەڵکو وەك گوتراوە (چاکەی بکەو بەئاوێی دابدە!) چونکە مادام مسوڵمان ئەوەی کەدەیکات وەك خواپەرستی‌و فەرمانبەری (طاعة) ئەنجامی دەدات، جێی خۆیەتی بۆ کرێ‌و پاداشتەکەی، جگە لەخوای دادگەرو سوپاسگوزار، چاوەڕوانی لەکەسی دیکە نەبێت، بۆ ئەوەی ئەگەر هاتو بەرانبەرەکەی برایەکی چاك نەبوو و برایانە ڕەفتاری نەکرد، ئەو ڕەفتارە دزێوو سپڵەیی‌یانە نەبێتە هۆی ساردبوونەوەو خاوبوونەوەی لەچاکەکاری‌و وەفاداری‌و بەردەوام‌بوون لەسەر ئەو خواپەرستی‌و طاعەتە گەورەو گرنگە!

ئەبو هورەیرەش خوا لێی ڕازی بێ لەو بارەوە ئەم فەرموودە مەزنەمان بۆ دەگێڕێتەوە: ﴿..ان رجلا قال: يارسول الله إن لي قرابة

(١) وەك هەم (حاکم) لە (عامر) ئەویش لە (عبدالله بن الزبير) ئەویش لەبابی گێڕاویەتەوە، وەهەم (إبن أبي حاتم) لە (عروة) گێڕاویەتەوە، بڕوانە: صفوة البيان لمعاني القرآن، ل٥٩٥

أصلهم ويقطعوني، وأحسن إليهم ويسيئون إلي، وأحلم عنهم ويجهلون علي! فقال: لإن كنت كما قلت فكأنما تسفهم الملّ، ولايزال معك من الله تعالى ظهير عليهم مادمت على ذلك﴾ رواه مسلم، واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هەندێك خزمم هەن، سەردانیان دەكەمو ئەوان دەمپچڕێنن، وەچاكەیان لەگەڵ دەكەمو ئەوان خراپەم لەگەڵ دەكەن، وەلەگەڵیان هێدی‌و مەندمو ئەوان نەفامیم لەگەڵ دەكەن! فەرمووی: ئەگەر تۆ وابی كەگوتت ئەوە وەك ئەوە وایە لمی گەرمیان پێ‌بخۆرێنی، وەهەتا تۆ لەسەر ئەوە بەردەوام بی هەمیشە لەخوای بەرزەوە پشتیوانت هەیە لەبەرانبەریان‌دا.

بەڵێ... بەدەردی یەكێك لەزاناو پێشەوایانمان دەرهەق بەكەسێك كەلەبەرانبەری چاكەكاری‌و برایەتی‌و دڵسۆزی وی‌دا خراپەكاری‌ی دەكرد فەرموویەتی: (لئن هو عصى الله فينا فإنا لنطيع الله فيه!!) باهەركەسێك لەهەڵس‌و كەوت‌و ڕەفتاری لەگەڵمان‌دا سەرپێچی خوای كردو خۆی دووچاری تاوان‌و لاوازی كرد، ئێمە بەپێ‌ی فەرمانی: ﴿وأحسنوا ان الله يحب المحسنين﴾ البقرة (١٩٥) هەر چاكە بكەین‌و فەرمانبەری‌و بەندایەتی خوا بكەین لەهەڵس‌و كەوتمان لەگەڵی‌دا.

ئنجا لەڕاستی‌دا ئەگەر بێت‌و ئاوا نەكەین - كەگوتمان - ئەوە كۆمەڵ‌و كۆمەڵگای ئیسلامیمان دەبنە گۆڕەپانی پێش‌بڕكە (مسابقة)ی خراپەو خراپەكاری، لەباتی ئەوەی مەیدانی پێش‌بڕكەی خواپەرستی‌و چاكەكاری بێت، وەبێگومان ئەگەر وانەكەین ئەوا مانای وایە هەموو ئەو دەقانەی قورئان‌و سوننەت كەفەرمان دەكەن بەچاكەكاری‌و خێرخوازی‌و دڵسۆزی‌و سوود گەیاندن بەمسوڵمانان‌و، وەڵامی خراپە دانەوە بەچاكەو بگرە چاكتریش ﴿إدفع بالتي هي أحسن السيئة ..﴾ المؤمنون (٩٦)، هەمووی فەرامۆش كران‌و لەكارخران، چونكە بەڕاستی هەروەك

پێشینان گوتوویانە (پیاوەتی گۆشتی بەلەكە دەبێ بیچڕی!) وەكۆمەڵگاش حەتمەن لەخەڵكی نەخۆش و بێ وەفا هەر خاڵی نابێت و، ئینسان ئەگەر بێت و هەرچی چاكەی لەگەڵ نەكات و وەڵامی چاكەكەی بەچاكە نەداتەوە، چاكەی لەگەڵ نەكات سەرەنجام وەك (درۆزناو) تووشی ئیشك بوون و چۆڕەبڕبوون دەبێ و بڕۆ بەخێر هاتی!!

كۆتایی ئەم خاڵەش بەم سەرگوزەشتە پڕ پەندو عیبرەتە دێنم:

دەگێڕنەوە كابرایەكی زۆر خێرخواز نان بدەو سەخی دەبێ، ڕۆژێكیان یەكێك دەچێتە لای و داوای یارمەتی و كۆمەكی ی لێ دەكات، ئەویش زۆر خزمەتی دەكات و ئەوەندەی پێشی دەكرێ یارمەتی ی دەدات، بۆ ڕەوانە كردنەوەیشی بۆخۆی ماوەیەكی باش لەگەڵی دەچێ و ولاخێكی زۆر ڕەسەنەنیشی پێ دەبێت! بابای خێرپێ كراو پێ ی دەڵێ لەبەر ئەوەی كاتی خۆی «سوار» بووم و ئێستاش ئەسپم نەماوە، ئەگەر زەحمەت نەبێ ئەسپەكەتم بدەیە تۆزێك ڕمبازێنی پێ بكەم! ئەویش ئەسپەكەی وێ دەدات و چەند جارێك ئەسپەكە تاو دەدات و دەیهێنێ و دەیبات، هەتا دواجار لەكابرای خێرخواز نزیك دەكەوێتەوەو پێ ی دەڵێ: من خوا حافیزو تۆش بگەڕێوەو ئەم ئەسپە بۆ من باشەو، ئاوزینگێكی لێ دەدات و تێ ی دەتەقێنێ و دەڕوات، ماوەیەك دوور دەكەوێتەوەو كابرای خاوەنی ئەسپ دەڵێ: تۆزێك بوەستە یەك دوو قسەت لەگەڵ دەكەم و بڕۆ خوات لەگەڵ! ئەویش تۆزێك پێ دەگرێتەوەو دەڵێ: فەرموو چیت هەیە بیڵێ! دەڵێ: ئەسپەكە بەرەو بڕۆ بەگەردن ئازایی پێتی دەبەخشم و لێی ناپێچمەوە، بەڵام یەك تكام هەیە، ئەویش ئەوەیە كەلەلای هیچ كەس مەڵێ ئەو ئەسپەم ئاوا دەست كەوتووەو فڕاندووە! دەڵێ بۆچی؟ دەڵێ: تاكو چاكەو خێر كردن لەدڵی خەڵكی دا نەمرێ (حتى لايموت المعروف في قلوب الناس)و خەڵك لەچاكەكردن پەشیمان نەبێت!!

# خاڵی شەشەم: نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەك و جیا

هەروەك چۆن (ڕێز لەبوون و کاری یەکترنان) زادەو بەرهەمی (برایەتی قووڵ و فراوان)ە، بەهەمان شێوە (نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بەیەك و جیا)ش بەرهەم و ئەنجامی (بەجێهێنانی مافی برا لەبەر خوا)یە، چونکە هەروەك چۆن ئەگەر برایەتی ڕاستەقینەو قووڵ و فراوان بێ وا لەمسوڵمان دەکات کەڕێزو تەقدیریان هەبێ بۆ بوون و کارو خەباتی یەکتر، بەهەمان شێوەش ئەگەر لەبەر خاتری خوا برایەتی لەگەڵ یەکتر بگرن و ئەرك و مافەکانی یەکتر جێبەجێ بکەن، بەبێ هیچ جۆرە چاوەڕوانی یەکی تر، دیارە دەروون و دەر (ظاهر وباطن)و پاش ملەو بەرەو ڕووشیان لەگەڵ یەکتردا وەك یەك دەبن.

ئێستاش دوای ئەم برە ڕوونکردنەوەیە بابچینە سەر توێژینەوەی ئەم باسەو پێیدا بچینە خوار:

یەکێك لەخەسڵەتە هەرە بەرزو پەسندەکان (الفضائل)ی ئینسانی مسوڵمان، دەرو دەروون وەك یەك بوون و، قسەی دڵ و زمان پێکەوە جووت بوون و، هەڵوێستی پاش ملەو بەرەو ڕوو لەیەك جیانەبوونە! وەلەڕاستیدا لەیەك جیابوون و پێکەوە دژ بوونی ڕواڵەت و دەروون، یان زمان و دڵ، بە... لەنەخۆشی یە هەرە کوشندەو خەسڵەتە هەرە نزم و پەستەکان (الرذائل) دادەندرێ، ئەگەر لەهەمووشیان پیسترو نزمتر نەبێ!

ئنجا ئەم خەسڵەتە بەدو دزێوە ئەوەندەی بەسە کەبۆتە دووڕوو و

نیشانەی هەرە زەق‌و سەرباسی پێناسەی كۆمەڵی دەغەڵ‌و دووڕووەكان (المنافقون)! بۆونە باسەرنجی ئەم ئایەتانە بدەین كەوەسف‌و پێناسەی ئەو كۆمەڵە پۆخەڵ‌و دغەڵە دەكەن:

■ ﴿ومن الناس من يقول آمنا بالله وباليوم الأخر وماهم بمؤمنين. يخادعون الله والذين آمنوا ومايخدعون إلا أنفسهم ومايشعرون. في قلوبهم مرض فزادهم الله مرضا ولهم عذاب أليم بما كانوا يكذبون. وإذا قيل لهم لاتفسدوا في الأرض قالوا إنما نحن مصلحون. ألا إنهم هم المفسدون ولكن لايشعرون. وإذا قيل لهم آمنوا كما آمن الناس قالوا: أنؤمن كما آمن السفهاء؟ ألا إنهم هم السفهاء ولكن لايعلمون. وإذا لقوا الذين آمنوا قالوا آمنا وإذا خلو إلى شياطينهم قالوا إنا معكم إنما نحن مستهزؤن. الله يستهزئ بهم ويمدهم في طغيانهم يعمهون﴾ البقرة (٨ـ١٥).

■ لەشوێنێكی دیكەدا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿إذا جاءك المنافقون قالوا نشهد إنك لرسول الله والله يعلم إنك لرسوله والله يشهد ان المنافقين لكاذبون. إتخذوا أيمانهم جنة فصدوا عن سبيل الله إنهم ساء ماكانوا يعملون. ذلك بأنهم آمنوا ثم كفروا فطبع على قلوبهم فهم لايفقهون. وإذا رأيتهم تعجبك أجسامهم وإن يقولوا تسمع لقولهم كأنهم خشب مسندة يحسبون كل صيحة عليهم هم العدو فاحذرهم قاتلهم الله أنى يؤفكون...﴾ المنافقون (١ـ٤).

ئەگەر لەم ئایەتانەو هاووێنەکانیان - کەلەقورئانیدا زۆرن - وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە:

أ- لەیەك جیابوونی زمانو دڵو نەخۆشبوونی دەروون.

ب- دژی یەکتربوونی دیوی ئاشکراو پەنهان.

ج- فێڵبازیو درۆ کردن.

د- خراپەکاریو لافی چاکەکاری لێدان بەدرۆو فیشاڵو هەست نەکردن بەخراپی خۆ.

هـ- گێلیو نەفامی پاڵدانە لای مسوڵمانانو خۆ بەژیرو وریاو زۆرزان زانین.

و- دووڕوویيو پێشاندانی دوو ڕووی دژ بەیەك.

ز- گاڵتەو یاری کردن بەخەڵکی مسوڵمان.

ح- شایەتیدان بەدرۆو بەساختە لافی مسوڵمانەتی لێدان.

ط- سوێند خواردنی بەدرۆو خەڵك لادان لەرێی خوا - بەهۆی ئەو خەسڵەتە بەدانەوە ..

ي- دڵمۆرکرانو نەبوونی شارەزاییو تێگەیشتنی ڕەسەن.

ك- قەدو قیافەو دیمەنی سەرنج ڕاکێشو هەست بزوێن - وەك پێشاندانی سیمای ساختەی ئیسلامی ..

ل- قسەی لووسی زرقو برقو زمانی شیرین.

م- بۆشیو بێ کاکڵو جەوهەریو قرپۆکی.

ن- ترسنۆکیو ڕاچڵەکین لەگەڵ بیستنی هەر دەنگو چرپەیەك.

هەرکام لەم خەسڵەتانە - کەمونافیقەکان زۆری تریشیان هەن - ڕەگو ڕیشەکەیان دەچێتەوە سەر ئەو پێکەوە دژ (تناقض)بوونەی ڕواڵەتو پەنهان یان زمانو دڵەی کەخوای کاربەجێ ناوی ناوە دەروون نەخۆشبوون ﴿في

قلوبهم مرض﴾ کەئێستا دەروونناسەکان لەکتێبی سەربەخۆدا لێی دەدوێن‌و بەنەخۆشی‌یەکی زۆر مەترسی‌دارو بێزەزای دەروون‌و کەسایەتی مرۆڤ سەیری دەکەن‌و بەدووانەتی (الإزدواجية)و بەلەت‌بوونی کەسایەتی (إنفصام الشخصية) ناوی دەبەن!

لەڕاستیشدا هەروەك چۆن ڕیشەو بنکی نیفاق‌و دەغەڵی ئەو نەخۆشی‌و دەردەیە، میکرۆبی ئەو نەخۆشی‌یەش ترسنۆکی‌و بێ‌جورئەتی‌یە، چونکە بابای ترسنۆك‌و بێ‌جورئەت واقیعێك دەبینێ بڕوای پێ‌ی نیە، بەڵام غیرەت‌و جوامێری ئەوەشی نیە بەڕاشکاوی‌و بێ‌پەردە هەڵوێستی لەدڵ‌و قەناعەت هەڵقوڵاوی خۆی لەبەرانبەری‌دا دەربڕێ، بۆیە بەڕواڵەت‌و سەرزارەکی‌و ڕووکەشی وایێشان دەدات کەبڕوای پێ‌یەتی‌و لەگەڵی دایەو لەدەروون‌و پەنهانیشەوە ڕەفزی دەکات‌و ڕقی لێ‌یەتی‌و دژایەتی دەکات‌و سەرەنجام ئەم حاڵەتە پیسە دروست دەبێ، کەوەك گوتمان دەبێتە ڕیشەو بنکی دەغەڵی‌و نیفاق.

دیارە پێغەمبەری پێشەواشمان ﷺ کەفەرموویەتی: ﴿...وتجدون شر الناس ذاالوجهين الذي يأتي هؤلاء بوجه وهؤلاء بوجه﴾ متفق عليه، واتە: وەدەبینن خراپترینی خەڵکی ئینسانی دوو ڕوویە، ئەوەی کەدەچێتە لای ئەمانە، بەڕوویێك‌و لای ئەوان بەڕوویێکی تر.

بۆیە وای فەرمووە، چونکە بەڕاستی لەیەك ترازانی دڵ‌و زمان‌و پێکەوە دژبوونی ڕواڵەت‌و پەنهانی ئینسان مەترسی‌دارترین نەخۆشی‌و جۆری تێکچوونی کەسایەتی‌یەتی! ئایا هیچ نەخۆشی‌یەك لەوە بێزەزاترو هیچ تێکچوون‌و شێوانێکی کەسایەتی لەوە سەخت‌تر شك دەبرێ کەبەشێکی کەسایەتی مرۆڤ دژی بەشێکی بێت‌و، ئاژاوەو کێشەو دووبەرەکی‌و ناکۆکی لەنێو خودی ئینساندا دروست بێت‌و کەسایەتی

مرۆڤ ببێتە شەڕگەو شوێنی تێك گیران و گوریس پچڕکێنە؟!! مەگەر ناکۆکی و تێك گیران لەوە سەخت و دژوارترو بەزەڕتر هەیە ئینسان لەگەڵ خۆی بەشەڕ بێت؟! وەئایا کەسێك لەگەڵ خۆی‌دا سەرگەرمی شەڕو ئاشووب و تێك گیران بێ قەت دەیپەرژێتە سەر ئەوە کەلەگەڵ هیچ کەسێك و هیچ شتێکی تردا بجەنگێ؟ ئایا وڵاتێك گیرۆدەی شەڕو ئاشووب و هەراو گێچەڵی نێوخۆ (الفتنة الداخلية والحرب الأهليه) بووبێ هیچ بەرهەڵستی و بەرگری بۆ دەکرێ لەبەرانبەر دوژمن و ناحەزە دەرەکی‌یەکاندا؟!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

«ئیمان» ئازایەتی و جوامێری و جورئەت و بوێری و ڕاشکاوی و ڕوونی و ڕێك و ڕاستی و بێ گرێ و گۆڵی و بێ حیلەو فێڵی‌یەو دەبێ ئینسانی بڕوادارو مسوڵمان زۆر وریای خۆی بێ و، هیچ کام لەم خەسڵەتە بەرزو جوانانەو هاووێنانیان لەئیمانەکەی دوا نەکەون و، گیرۆدەی خوو و خەسڵەتە پیس و گڵاوە هەڵقوڵاوەکانی زەلکاوی کوفرو نیفاق نەبێت، بەتایبەت دووڕوویی و لەیەك جیابوونی دڵ و زمان و ئاشکراو پەنهانی، چونکە وەك ڕوونمان کردەوە ئەو خەسڵەتە پیس و بەدە بنك و ڕیشەی دەغەڵی و نیفاقەو، نەخۆشی‌یەکی یەکجار کوشندەو بێ‌ئامانی کەسایەتی مرۆڤە، هەرکەسێکیش دووچاری ببێ بەگەڕانەوە (نوبة)یەکی زۆر قووڵ و جیددی نەبێ لێی ڕزگار نابێ، گەڕانەوەیەکی‌وا کەڕەگ و ڕیشە قووڵ و ڕۆچووەکانی لەدەروون و کەسایەتی مرۆڤدا بسووتێنێ و، بنك و بنەمای لەقولایی وجوودی ئینسان دەربێنێ، وەك خوای کاربەجێ و پەنهان فەرموویەتی: ﴿ ..إلا الذين تابوا وأصلحوا واعتصموا بالله وأخلصوا دينهم لله.. ﴾ النساء (١٤٦).

زیانو مەترسی ی ئەم نەخۆشی یەش جگە لەسزاو تۆڵەی دواڕۆژو مایەپووچیو دەم لەپووش بوونو ڕەنج بەزایە چوونو دەسخەڕۆ بوونی بەهۆی پووچیو قرپۆکی کردەوەکانیەوە، دوو شتی تریشە:

أ- گەندەڵ بوونو رووخانو لەبەین چوونی کەسایەتی ئەو کەسەی کەدووچاری ئەو حاڵەتە دەبێ، وەك پێشتر روونمان کردەوە.

ب- درزو کەلێن تێبوونی ڕیزی کۆمەڵی مسوڵمانانو بڵاوبوونەوەی بێباوەڕیو بێمتمانەییو ڕاڕاییو نادڵنیایی بەرانبەر بەیەکترەوە (دیارە ئەمە لەکاتێك دا دەبێ کەنەخۆشی ی گۆرین زۆر تەشەنە بکاتو ببێتە شتێکی باو لەنێو کۆمەڵگادا).

ئنجا هەروەك چۆن هەرشتێك وەك بەرچاو ڕوونیو دڵئارامیو دەروون دامەزراویو دڵنیایی (طمأنینة) بەباری ئیجابی دا کارناکاتە سەر کەسایەتی ئینسانو تێرو تەواویو نەلەخشاوی ی، وەهیچ شتێکیش بەئەندازەی دوو دڵیو گومانو دڵەڕاوکەو ڕاڕاییو بەرچاو لێڵی بەباری سەلبی دا کاری تێناکات، هەربۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ ..فإن الصدق طمأنينة والكذب ريبة ﴾ رواه الترمذي وقال: حديث صحيح.

بەهەمان شێوەش هیچ شتێك بەئەندازەی برایەتیو یەکتر خۆشویستنو بەتەنگ یەکترەوە بوونو باوەڕو متمانە بەیەکتربوون کارناکاتە سەر پتەوکردنو پێکەوە جۆشدانی ڕیزی مسوڵمانانو مەحکەم کردنیو، بەپێچەوانەشەوە لەیەکتر ئەمین نەبوونو نادڵنیاییو بێمتمانەیی، کەبەهۆی نەخۆشی ی ناوبراوەوە بڵاو دەبێتەوە لەهەموو شتێك پتر ڕیزی مسوڵمانان لەرزۆكو لاواز دەکاتو درزو کەلێن دەخاتە نێوانیانەوە.

دیارە چارەسەری ی ئەو نەخۆشی یە پیسەش هەر بەوە دەبێ کەئینسان

چاوێك بەئیمانو مسوڵمانەتی‌یەکەی‌دا بگێڕێتەوەو، بزانێ کەخوای پەروەردگار ﴿یعلم خائنة الأعین وما تخفي الصدور﴾ غافر (١٩) وەوەك فەرموویەتی: ﴿ولقد خلقنا الإنسان ونعلم ماتوسوس به نفسه ونحن أقرب إلیه من حبل الورید. إذ یتلقی المتلقیان عن الیمین وعن الشمال قعید. مایلفظ من قول إلا لدیه رقیب عتید﴾ ق (١٦-١٨).

وەوەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إن الله لاینظر إلی أجسامکم ولا إلی صورکم ولکن ینظر إلی قلوبکم﴾ رواه مسلم.

پاشان زۆر بەخەستی‌و سەختی دەست بکات بەکۆشش لەگەڵ نەفسی خۆی‌داو بەردەوام لەخۆی وریا بێت، شتێك نەکاتو نەڵێت کەلەدڵی‌دا نەبێ‌و قەناعەتی پێ‌ی نەبێ، وەهەر شتێکیشی بەچاكو ڕاست زانی بەڕاشکاوی‌و جەریئانە بەمسوڵمانانی خوشكو برای بڵێ‌و پێیان ڕابگەیەنێ - لەسنووری شەرعداو بەپێ‌ی داخوازی‌ی بەرژەوەندی - وەهەر شتێکیشی پێ‌هەڵەو ناتەواو بوو دیسان بەهەمان شێوە پێیان ڕابگەیەنێ‌و ئاگاداریان بکاتەوەو، نەلەگوتنی هەق‌داو، نەلەڕەخنەگرتنو پووچاندنەوەی ناهەق‌دا - لەسنووری شەرعدا - ڕووپامایی‌و ڕوودەربایسی لەگەڵ هیچ کەس‌و بۆ هیچ کەس نەکاتو، ڕێكو ڕاستو چاكو پاكو سافو ساغو ڕوونو ڕاشکاوو بێ‌گرێ‌و گۆڵ بێ، وەکارو چالاکی ئیسلامیش لەهەر ڕوو وبوارێکەوەو لەهەر گۆشەو کەنارێکەوەو بەهەر شێوەو بارێك‌دابێ - مادام لەشیرازەی شەرع نەترازابێ - هەر بەکاری خۆی بزانێ‌و دڵی پێ‌ی خۆش بێ‌و بەتەنگی‌یەوە بێ‌و، بۆ چاك کردنو گەشەو بەرەوپێش‌چوونی دڵسۆزو پەرۆش بێ.

بەڵام خوانەخواستە:

بەرەو ڕوو وبەڕواڵەت ڕێز لەیەکترگرتن و لەپاش ملە زەم و غەیبەتی یەکترکردن! وەڕووبەڕوو مەدح و بەیەکتر هەڵاگوتن و پاش ملە یەکتر وردو خاش کردن! وەلەڕوودا لەگەڵ یەك پێکەنین و ڕووخۆش‌بوون و، پاش ملە لەدڵدا یەکتر بوغزاندن و دڵنەخۆش‌بوون! لەلای یەکتر لەیەك ڕازی‌بوون و یەکتر پێ‌پەسندبوون و پاش ملە ڕەخنەو توانج لەیەکتر گرتن و یەکتر پێ‌هەڵەو گومڕابوون!

بەڵێ ئەم جۆرە ڕەفتارو هەڵس و کەوتە بێگومان ـ وەك پێشتر گوتمان ـ دەردو نەخۆشی‌یەکی دژوارو سەختەو حەوجێ‌ی چارەسەرو دەرمانیشە!

ئنجا باسەرنج بدەین داخوا چۆن چۆنی ئەم دوو بنچینە گەورەو گرنگە کەلەم خاڵی پێنجەم و شەشەمەدا باس کران لەواقیعی ئەمڕۆی کوردستاندا بەسەر حاڵەتی ئیسلامی‌دا جێ‌بەجێ دەکرێن!

بێگومان ئەمڕۆ لەگۆڕەپانی کاری ئیسلامی‌دا چەند کۆمەڵ و بزووتنەوەو تەوژمێکی ئیسلامی هەن کەبەبیرو بۆچوون و ئیجتیهادی جۆراو جۆرەوە سەرگەرمی کارو خەباتن بۆ بووژاندنەوەی ئیسلام و گەشە پێدانی و بەرەو پێش بردنی، بەهیوایٰ ئەوە کەکۆمەڵگای کوردەواری بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەسەن لەئیسلام تێ‌بگەیەنرێنەوەو پێ‌ی ئاشنا بکرێنەوە تاکو سەرەنجام ئیسلام ببێتەوە بەتاقە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان و گوزەران و، تەنها پەناو سێبەرو ڕێگا چارەو چارەسەری گەلی کوردی مسوڵمان.

جادیارە هەرچەندە ئەسڵ لەکۆمەڵی مسوڵمان و چالاکی و خەباتی‌دا یەکبوونە، بەڵام خەیاڵ پلاو شتێکەو هەڵس و کەوتیش لەگەڵ واقیعی شیرین یان تاڵدا شتێکی ترە!

ئەمڕۆ وەك واقیع مسوڵمانانی کوردستان ـ وەك زۆربەی شوێنەکانی دیکەی جیهانی ئیسلام ـ یەك کۆمەڵ و خاوەنی یەك جۆرە بیروڕاو

(إجتهاد) نین، کەواتە حەتمەن دەبێ بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە بژین و کاربکەن، تاکو بەهەوڵ و هیممەتی هەموو لایەك واقیعێکی ئیسلامی‌ی شەرعی‌ترو بەهێزو پێزتر لەوەی ئەمڕۆ بخەملێنن، لەسەر چەند بنەماو بنچینەیەك ڕێك بکەون، جا بەندە پێ‌ی وایە ئەو سێزدە (١٣) خاڵەی لەم کتێبەدا (چەند ڕێنموونی‌یەك بۆ حاڵەتی ئیسلامی لەکوردستاندا)دا دەیانخەمەڕوو، چەند یاساو بنچینەیەکی گرنگ‌و پێویستن لەو بارەوە.

دیارە لەبەشی یەکەم‌و دووەمدا خاڵەکانی (١، ٢، ٣، ٤) توێژراونەوەو، ئەوە لەم بەشەشدا ئەم دوو خاڵە (٥، ٦) قسەیان لێ‌کراو چۆنیەتی جێ‌بەجێ‌کردنیشیان بەسەر حاڵەتی ئیسلامی‌دا بەو شێوەیە دەبێ کەهەر کام لەلایەنە پێکهێنەرەکانی حاڵەتەکە زۆر بەتەئکیدو جەخت کردنەوە ئەندام‌و لایەنگرو دۆستەکانی خۆیان تێ‌بگەیەنن‌و باربهێنن کە (برایەتی) ئێمەی مسوڵمان‌و ئیسلامی‌و جێ‌بەجێ‌کردنی ئەرك‌و پێویستی‌و مافەکانی ئەو برایەتی‌یە - کەئێمە وەك «مستێك لەجەواڵێك» بیست‌و حەوت (٢٧) دانەمان لێ ژماردن - وەك باقی ئەرك‌و پێویستی‌یە شەرعی‌یەکانی ئیسلامەتی بۆ وێنە: نوێژ، ڕۆژوو، زیکر، دووعا، کاسبی حەڵاڵ، خۆپاراستن لەحەرام، لەبەر خواو بەبێ هیچ جۆرە چاوەڕوانی‌یەك لەطەرەفی بەرانبەر - وەك سوپاس کردن‌و چاکە دانەوە - جێ‌بەجێ بکەین، چونکە وەك ڕوونمان کردەوە برایەتیمان لەگەڵ یەکتر بەهەموو پێداویستی‌یەکان (مستلزمات)یەوە، بەشێکی گرنگ‌و گەورەی خواپەرستی‌و دینداریمانەو، وەك چۆن باقی لایەن‌و بەشەکانی خواپەرستی‌و دینداریمان بەس بۆ خوا ئەنجام دەدەین ﴿إياك نعبد﴾، پێویستە ئەم بەشەش بەهەمان شێوەو چۆنیەتی بێ، چونکە خواپەرستی (عبادة) هەمووی یەك شتەو یەك حوکمی هەیە.

هەروەها هەركام لەو لایەنە پێكهێنەرانەی حاڵەتی ئیسلامی، خەڵك‌و شوێن كەوتووانی خۆیان زۆر بەتەئكیدەوە لەسەر ئەوە پەروەردە بكەن‌و ڕابێننن كەهەمیشەو دایم‌ودەرەم هەست‌و نەستی دەروون‌و قسەی زمانیان یەك بێت‌و، دڵ‌و دەروون‌و دیوی حەشارو پەنهانیان ئەگەر لەڕواڵەت‌و دەرەوەیان چاكترو پاكتریش نەبێ لەگەڵ خوشك‌و برایانی مسوڵمانیاندا، لانی كەم وەك یەك بن، وەك یەكێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دوای شەهید بوونی خەلیفەی دووەم - عمر بن الخطاب - خوای لێ ڕازی بێ فەرمووی: (أشهد أن سریرته كانت خیرا من علانیته!!).

دیارە ئەم بارهێنان‌و پەروەردەكردن‌و ڕاهێنانەش لەسەر ئەو جۆرە خەسڵەتانەو ئەو شێوە هەڵس‌و كەوت‌و ڕەفتارە بەرلەوەی بەرپرس‌و مشوور خۆرانی كاری ئیسلامی بەقسەو وتارنووسین فێری خەڵك‌و شوێن كەوتووانی خۆیانی بكەن، دەبێ بەزمانی كردارو ڕەفتارو بوونە سەرمەشق ئەوەیان لێ حاڵی بكەن، نەك خوانەخواستە لەدەروون‌و قەناعەتی خۆیاندا (برایەتی)و ئەرك‌و مافەكانی‌و پێداویستی‌یەكانی هەر لەجوغزی گچكەو تەسكی كۆمەڵ‌و لایەنەكەی خۆیاندا بەدی (تصور) بكەن‌و، بەكردەوەو ڕەفتاریش پێشانی پەیڕەوانیان بدەن كەهەر ئەوان برایانن!! دیارە لەحاڵێكی وادا ئامۆژگاری‌و ئاڕاستەكردن (توجیهات)ەكەیان دەبێتە شتێكی بێ ڕووح‌و بێ جەوهەرو سەرەڕای ئەوەی كەدووچاری ئەو دەردو نەخۆشی‌یە سەختەش دەبن كەباسمان كرد.

ئیدی بەهیوای ئەوە كەهەركام لەبزووتنەوەی ئیسلامی‌و بەكۆرتووی ئیسلامی‌و ڕاپەڕینی ئیسلامی‌و زانایانی شەرع‌و برایانی سەلەفی‌و ئەهلی طەریقەت‌و باقی مسوڵمانانی تریش لەجاران زیاترو لەپێشوو باشتر لەگەڵ یەكتردا بكەونە پێشبڕكە (مسابقة)ی برایەتی‌و چاكەكاری‌و دڵسۆزی‌و

بەزەیی‌و ڕێزو پەرۆش بۆ یەكتر ﴿وفي ذلك فليتنافس المتنافسون﴾ المطففين (٢٦).

## لەكۆتاییشدا دەڵێم :

بەڕاستی بەڕاستی ئەم مەیدانی هەڵس‌و كەوت‌و ڕەفتاری ڕاست‌و درووست‌و شەرعی‌یانە بەكورتی (برایەتی‌ی ڕاستەقینە) لەگەڵ یەكتردا كردنە، چاكترین سەنگی مەحەكی ئیمان‌و تەقوا‌و مسوڵمانەتیمانە‌و، باشترین پێوەر (مقیاس)ی تێگەیشتن‌و پێگەیشتنمانە‌و هەتا ئێمەی مسوڵمان‌و ئیسلامی لەو بوارو مەیدانەشدا سەركەوتن بەدەست نەهێنین‌و دینداری كردنی خۆمان نەسەلمێنین‌و لەبواری برایەتی نێوخۆماندا شتێك بەشتێك نەكەین، واباشە خەیاڵ پلاوان نەكەین‌و بەردی زل زل دەست نەدەینێ، چونكە «كەس بەخەیاڵ پلاو نەبووە بەماڵ» و «بەردی گەورەش نیشانەی پێ‌دانەدانە».

والحمد لله الكبير المتعال على هذا الحال
وفي كل الأحوال.

٦ ی شەووالی ١٤١٦

٢٥ ی شوباتی ١٩٩٦

مەریوان

